# دەنگی پێی ئاو

بڵاوکردنەوەی هەمبانەبۆرینە



ناوی بەرهەم: دەنگی پێی ئاو
بابەت: شیعر
نووسەر: سوهراب سپێهری
وەرگێڕانی: ڕێبوار سیوەیلی
چاپی یەکەم: 1989، دانمارك، چاپی دووەم: 1990، دانمارك، چاپی سێیەم: 2007، کوردستان، هەولێر.
تیراژ: 2000
ژمارەی سپاردن (   )ساڵی 2007
لەسەر ئەرکی کتێبفرۆشی هەمبانەبۆرینە چاپکراوە

پێرست

## وتەیەك

لە دەروانێکی پڕ هات و هاواردا ،کە بابەتەکان لە خۆرهەڵات و خۆرئاواوە دەنوسران و بڵاودەکرانەوە، بەناو رۆشنبیرەکانیش ساتێك بەلای سروودی بوون دا ئاوڕیان نەدەدایەوە – سوهراب سپێهری، شاعیرو هونەرمەندی بە توانای ئێران، وەك چیایەکی ئازاراوی لە داوی ئەم ڕاوەدا دەستی کردە قسە و لە ئاوابوونی خۆر دوا. بەسەر دەشتی ووشك بووی پڕ گوڵاڵە سوورەدا بارانی پڕ مانای داکرد.

سوهراب لەو رۆژگارەدا پەی بە رەمزی بازنەیی ئەبستراکتی سەوز بردبوو، کە وەك تەواوکەرێکی هەمیشەیی ماڵەکەی خۆی، خۆی دەنواند. ئەم بازنەیە وەك نیشانەی کامڵبوونی مرۆڤایەتی لە هونەری خۆرهەڵات و خۆرئاوادا خۆی دەنوێنێت. لە نزیك چەقی مەیدانی سووری ماڵەکەی ئەودا، گەورەترین ئەو بەردانە دەبینرێن کە وێنەی خواوەندی داییکی بەر لە مێژوویان بە شێوەیەکی تۆکمە و کۆمپوزسیۆنی لە سەر هەڵکەندراون. لێدانی دڵی ئۆرگانیزمیانەی ئەو، وەك بازنەیەکی لەیەك ئالاۆو دێتە بەرچاو کە بۆشاییەکی بۆ چرکە میکانیەکان نەهێشتۆتەوە. خانووەکەی سوهراب بەهۆی یەکبەیەکی وشەکانیەوە لەوسەری دیکەی شەوگارەوە، وەك کاتیگۆریەکانی خۆرهەڵات خۆی دەنوێنێت. (لێرەدا، چەمکەکان



دەبنە شوێنی تێڕوانین و تێڕوانینەکانیش شوێنی چەمکەکان دەگرنەوە). ماڵی سوهراب نەك تەنیا لە ماڵی هەر شاعیرێکی دیکەی هاوچەرخی ئێران زیاتر لەفەزایەکی مەعنەویدایە و گومبەزەکەی لە سەر چوار کۆڵەکەی تۆکمەو ڕەسەن وەستاوە"، ئەمە بێئەوەی کارەکانیشی فەلسەفاندنیان پێوە دیار بێت، بەڵکو جوانتر لە هەر هونەرمەندێکی هاوچەرخی ئیرانی، جگە لە چەند کەسانێك، قورسایی ڕەنگ و سێبەر و ڕۆشناییەکانی لە حەقیقەتی شینباوی دەریا و شەپۆلە ئاسمانیە میهرەبانەکان، لە ڕارەوی نێوان ئەفسوون و داهاتوودا بەرجەستە دەکرد. لەلای ئەو، ڕەنگ ڕازێکی سووڕباوی نەمرە.خاتوو ئاینە لایافە دەڵێت: لە هونەری غەیرە مەسیحیدا، بەوجۆرە بازنانە دەگوترێت بازنەی خۆر، ئەمانە لە سەر بەردە هەڵکەندراوەکانی دەورانی بەردینی نوێ دەبینرێن و مێژوویان دەگەرێتەوە بۆ پێش پەیدابوونی دۆزینەوەی بازنە.

سوهراب ئەوەی سەلماند کە بۆچی خامۆشانە لەگەڵ شۆڕ و سەرسەوزی بەهار و بەروبوومی هاویناندا، سەرگەرمی کارکردن بوو، بەبێئەوەی هیچ گوێ بداتە هات و هاواری کۆمەڵێك تارمایی "هەندێ لە رەخنەگرانی هاوچەرخی ئیران"، کە ئەوانە بەهەموو بێرێشەیی و تاریکبینی خۆیانەوە، دەیانویست هەواری دۆستی ئەو بڕووخێنن!

فەلسەفەی مێژووی هونەر داوەرێکی گەورەیە، تەنانەت جیهانی بوون حەقیقەتی سوهرابی بۆ ئەوانەش سەلماند کە لەتەمەنی کورتی پیسی نێو ژووری بلّق ئاسایاندا، بالّۆرەیان لێدەدا.

بەقسەی مونشی کاشانی :

قصه غصه دراز است و نشد معْلوم
تا کجا می کشد این رشتهء طولانی
(چیرۆکی خەم درێژە و ئاشکرا نابێ
ئەم داوە درێژە تاکوێ دەگات)

کۆتری ڕۆح و نیگای تێروانینی بۆ ژیان بە وردی خۆی دەکات بە نێو جەوهەری ڕۆحی شاراوەی دیاردە و شتەکاندا. لێهاتوویی سوهراب تەنیا هەر لە وەدا نیە کەمتر قسان دەکات و زیاتر پیشانمان دەدات، بەڵکو لێهاتویی ئەو لە وەدایە، کە هەست و ئیدراك دەبەخشێتە وشەکان.

سوهراب سپێهری نەك هەر دوپاتی کردەوە هونەری ژیان ژیانی هونەرە و پەیوەندی ئەوە لەگەڵ جیهانی بووندا، بەڵکو ئەوەیشی سەلماند کە گەردوونی بەرین و لەیلای پڕ نهێنی و ڕەمزی جیهان، (مایا) ناتوانن بیر و هونەری ئەو لەیەك دابڕن. ئەو وێنەیەی کە سوهراب لە سەر خۆی دەیدات بە دەستەوە، ئەوی وەك شاعیرێکی



نەرویجی (تاریە ڤێسواس) ،کردۆتە بۆیەکی ئەفسانەیی. سولّستا دەڵێت: "ئەفسانە مێژووی کەسێکە،کە بووبێتە مێژووی گشتی".

سوهراب خۆی لە جیهانی بووندا دۆزیوەتەوە و هەر ئەمەشە پالّی پێوەناوە کە دەورانی گەردوون و هەموو بەندوباوە کۆنەکانی ئەم هێزە لە چوارچێوە خورافیەکەیدا بەهۆی هێزی لۆگۆسەوە کەوەك پالّپشتێکی هونەر و بیر خۆی دەنوێنێت، بخاتە لاوە تاکو ڕەوتی بوون ئەزموون بکات، تاکو ئەودیوی زمان و سەمای ئەستێرەکان لەجیهانی مەزن و نەمردا بدۆزێتەوە .

بە گوتەی مەولانا:

عاقلان را یك اشاره بس بود
عاشقان را تشنگی زان کی رود؟
(بۆ هۆشمەندان تەنیا ئاماژەیەك بەسە
عاشقانیش کوا تینوێتیان دەشکێ؟)

شیعر و تابلۆکانی ئەم ئاواتارە کەلە ڕاستیدا هونەرمەندی شاعیرانی هاوچەرخی ئیرانیە، ئەوەی سەلماند و ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزیەتی کە ئەو نەیدەڕوانی بەڵکو دەیبینی: ئەگەرچی دەڵێت: "ئێمە هیچ!،ئێمە ڕوانین".

جێگەی ڕێز و خۆشحاڵیەکی زۆرە کە ڕۆشنبیرانی کورد گرنگی دەدەن بە شیعری هاوچەرخی ئیران. سوپاسی زۆریشم بۆ دۆست و شاعیری لاو ڕێبوار، لە پێناوی ئەو گرنگی دانەی بە کەلتوور و هونەری هاوچەرخ، هەروەها بۆ ئەوەی کە پێشەکی وەرگێڕانی شیعرەکانی سپێهری لە ئەستۆی ئەم قەڵەمە گرت.

ڕەزا ئەفشاری /1989

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەمە یەکەم جار نیە کە خوێنەری کورد شیعری هاوچەرخی فارسی بە زمانی کوردی دەخوێنێتەوە[1]. پێشتر لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا، تاق و تەرا شیعری هاوچەرخی فارسی بڵاوبونەتەوە. هەروەها یەکەمجاریش نیە نامیلکەیەك بە زمانی کوردی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکرێت. بەڵام یەکەمجارە[2] نامیلکەیەکی سەربەخۆ دەچێتە بەر دەستی خوێنەری کورد کە تایبەت بێت بە شاعیرێکی هاوچەرخی فارسی[3] و شیعری شاعیرەکە دەکاتە دیاری بۆ کتێبخانەی کوردی. لە وەرگێڕانی

[1] بۆ نووسینی ئەم پێشەکییە، سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:
- لیلی گلستان: سهراب سپهری، شاعر نقاش، امیر کبیر، 1359چاپی سێیەم، تاران،1972.
- رچا علوی: راه حق، مقدمه دربارۀ بودابیت، تاران(؟)
- سهراب سپهری: هشت کتاب. گهوری، چ1، 1355
- پرویز شکیبایی: صدای پای آب، متن شعر.

[2] ئەم قسەییە لە ساڵی 1989دا نووسراوە

[3] کە باس لە شیعری هاوچەرخی فارسی دەکرێت، مەبەستمان لەو قۆناغە شیعریەیە کە نیما یۆشیج (1897-1958) دەستیپێکرد.



ئەم شیعرانەدا زیاتر هەوڵم داوە ناوەڕۆك و شێوە نووسینی سپێهری وەکو یەك بگەیەنم چونکە شاعیر چ وەك نووسین و چ وەك دەربڕینیش ڕەوتی تایبەتی خۆی هەیە.. بەڵام مەسەلەی گەیاندنی دوورییە فەلسەفیەکانی بیری سپێهری بە ئاسانی خۆیان نادەن بەدەستەوە. لەم کاتەدا وەرگێڕ ناچەرە بگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك سەرچاوە بە تایبەتیش سەرچاوە ئاینییەکان وەك (قورئانی پیرۆز) و سەراپای تێکستەکانی کەلتووری ئاینەکانی هیند و خۆرهەڵاتی دوور. ئەم کارەش بۆمن ئاوا ئاسان نەبوو لە بە ئەوە دەمەوێت لە سەرەتاوە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم، کە دەبێت زیاتر کار لە شیعری سپێهریدا بکرێت، بنەماکانی بیرکردنەوەی ئەم شاعیرە قووڵ و جۆراو جۆرن، داهێنان و مامەڵکردنی شاعیریش لەگەڵ ئەو بنەیانەدا، لە پێناوی پتەوکردنی تیۆرە شیعرەکەیدا مەسەلەیەکی دیکەن و لێدوانێکی زۆریان دەوێت. وەنەبێت ئەم کارە تەنیا بۆ ئێمە زەحمەت بێت، ئێرانییەکان خۆشیان زۆر کەمیان لە سەر سپێهری نوسیوە[4] هۆی ئەمەش گەلێك زۆرن، بەڵام باوبوونی ئەو

[4] بۆ ئاگاداری خوێنەر لێرەدا ناوی ئەو کتێب و باسانە دەنووسمەوە کە تا کاتی چاپی ئەم ئەم نامیلکەیە (1989) سەبارەت بە شاعیری ناوبراو بڵاوکراونەتەوە و لە دوور و نزیکەوە ئاگاداریانم:
- سهراب سپهری، شاعر نقاش چاپی سێیەم (1982) تاران
- یادمان سهراب سپهری، کۆمەڵێك نووسەر، تاران (1989) لە چوار سەد لاپەڕەدا.
- حسن حسینی: بیدل، سپهری و سبك هندی، تاران (1989)

ڕوانگە سواو وتەقلیدیەی کە ڕەخنەگرەکان لێـوەی دەڕواننـە شـیعر و ئـەدەب، لــە ســەرووی هــەموو ئــەو هۆیانەوەیــە. بــەلای ئەوانــەوە چینایەتیکردنی شیعر لـە گۆڕێیە نەك شیعر خـۆی!. ئـەوان دەڵـێن: ئـەو شیعرەی ئاوێنەی زۆربەی کۆمـەڵ بێـت، شـیعرێکی ڕاسـتەقینەیە و ئـەو شیعرەش لـە جیهـانی خـودی شـاعیردا بمێنێتـەوە شـتێکی مـردووە. بـە مانایـەکی دی، شـیعری بـاش واتـە شـیعری پێشـکەوتنخواز و شـیعری خەراپیش، واتە شیعری کۆنەپەرسـتان، ئـەویان خزمـەت بـە چـینەکانی خــواروی کۆمــەڵ دەکــات و ئەمیشــیان لــە خزمــەتی ئیمپریــالیزمی جیهانیدایە!

دیارە بەم پێیە دەبێت نیوەی ڕاستی میراتی شیعری جیهانی واز لێبهێنرێت و شیعری سپێهریش لەو ڕوانگەیەوە، شیعری "بودازادە ئەشرافیەکان"ـە و شیعرێکی مردووە. ئەگەرچی ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت، بەڵام لە جێی خۆیدایە بە دوو دێڕی سادە و ساکار بە وانە بگوترێت:

پێویستە چاوەکانمان بشۆین و
جۆرێکی دی تەماشای جیهان بکەین..

(بێگومان ئەم قسەیە بۆ ساڵی نووسینی ئەم پێشەکییە ڕاستە (1989) دەنا ئێستا بە سەدان کتێب و سەرچاوە لەسەر ئەم شاعیرە لەبەردەستدان.



سوهراب سپێهری 1928–1980 یەکێکـە لـە شـاعیر و هونەرمەنـدە هاوچەرخەکانی ئیران[5]. زۆربەی تەمەنی خۆی لە شارەکانی کاشان و لە حاڵــەتی تــەنیایی و گۆشــەگیریدا بردۆتــە ســەر. ئــەم تەنیاییــە لەگــەڵ سرووشتی سەوز و ئاوی زوڵاڵ و سێبەری دار چنارە بـەرزەکان تێکـەڵ دەبێت و دەبێتە دەلاقەیـەك، کـە سـپێهری لێـوەی دەڕوانێتـە جیهـان و ڕووداوەکان. سپێهری وەك هەموو شاعیرێکی ڕەسـەنی دی کـە ڕەگ و ریشەیان لـە ناوچەی خۆیاندا هەیە، لـە سەرچاوەی ژیانبەخشـی عـەردی زادی خۆیەوە خۆراك وەردەگرێت. ئەم سەرچاوەیەش لە سەر زەویەکی وەك ئیراندا کە ڕابوردوویەکی شاعیرانەی مەزنی هەیە، بە ناچاری بـۆنی عیرفانی گرتوە[6].

لێرەوە عەشـق لـە شـیعری سـپهریدا دووریـیـەکی قـوڵ بـە خۆیـەوە دەگرێت و شـاعیریش ئـەزموونی خـۆی لـە ڕێگـەی ئـەم عەشـقەوە دەردەبڕێت. بەڵام بەو هۆیەوە کە سپێهری کـاری بـە ڕووداوەکـانی ڕۆژانە نیە، تەماشا دەکەین لەلایەکـەوە دەبێتـە عەشـقێکی دنیـایی و لەلایەکیتریشەوە دەبیتە عەشقێکی خودایی.

[5] سپێهری وەك چۆن شاعیرێکی لێهاتووە، ئاواش هونەرمەندێکی بە توانایە، بەداخەوە لێرەدا توانای ئەوەمان نەبوو لە سەر تابلۆکانی قسان بکەین.
[6] بڕوانە سەرچاوەی یەکەم ل:20

تایبەتمەندییەکی گرنگ لە مەودای بیری سپهریدا، کە زۆر کەم قسەی لە سەر کراوە ئەوەیە: هێنـدەی سـپێهری کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەری ئایینەکانی خۆرهەڵاتی دوور و هیندستانەوە، بە تایبەتیش ئایینی بـوداو تێکستی ووداکان، هێندە لە ژێر کاریگەری عیرفانی ئێرانیدا و میراتـی شیعری کلاسیکی فارسیدا نابینرێـت. لـە فەرهـەنگی ئـەو ئایینانـەدا، هەمیشـە جۆرێـك بانگهێشـتن دەبینرێـت، بانگهێشـتن بـۆ چـاکە و خۆشەویسـتی، بانگهێشـتن بـۆ پتـەوکردنی دۆسـتی و بیرکردنـەوەی ڕاست،کرداری ڕاست و هتد.. جێگەی سەر سووڕمان نیە کە بنەمای یوگای هینـدی لـە سـەر سـێ کوچـکە، یـان سـێ ڕێگـای بنـەڕەتی دامەزرابێت: ڕێگەی کردار، ڕێگەی زانست ڕێگەی عەشق[7]

ئەم بانگهێشتنە لە شیعری سپێهریدا بە چەندین شێوە دووبارە بۆتەوە. سپێهری هەمیشە بڕوای بە جۆرێك تەبایی لە نێوان شتەکاندا هەیـە.. پەیڕەوکردنی ئەم تەباییە لەلایەن مرۆڤەوە بۆ سروشـت و دەوروبـەر، لە ئاست گیاندار و درەخت و ئاودا، ناوەڕۆکی شیعری ئـەم شـاعیرە هەست ناسکە پێکدەهێنێت:

ئاو قوڕاو نەکەین:
واپێدەچێ لە دوورەدەست، کۆترێ ئاو دەخواتەوە.

[7] Karman Yoga, Jnana Yoga, Bhakti Yoga



ڕەنگە ئەم ئاوە پاکە بڕواتە بن سپیارێك[8]
تا بیشواتەوە خەمی دڵێك.
ڕەنگە دەستی دەروێشێك
نانێکی ڕەقی پێ تەڕ کات.

شاعیر دەیەوێت پەیامی ڕاستەقینە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت و تەبایی بخاتە نێوان مرۆڤ و روناکییەوە، هەورەکان لەت و پەت بکات و خۆری ڕاستەقینە بخاتە نێو دڵمانەوە:

ڕۆژێك دێم و
گوڵێکی یاسەمەن دەدەمە گەدایەك
دێم و لە بەردەمی ئەسپ و مانگاکاندا،
تفاقی سەوزی نەوازش ڕۆدەکەم.
بۆ مایینە تینووەکان، سەتڵێك شەونم دەهێنم
کەرێکی پەککەوتە لە سەر ڕێگایە،
مێشکەکانی لێدەر دەکەم.
هەر قەلـەڕەشکەی سنەوبەرێکی پێدەبەخشم.
بە مار دەڵێم:
چەند شکۆدارە بۆق!

[8] سپیار، سپیدار، دار چنار.

ئەم تەبایی یە ئەفسووناویە لەلای سپێهری سەرچاوەیەکی دیکەیشی لە دەروونی خۆیدا هەڵگرتووە. بەلای شاعیرەوە ئەوەی کە هەیە گیاندارە و ڕۆحیش وەك تەمێك بە سەراپای بۆشایی جیهاندا بلاّوبۆتەوە. بۆیە هەموو شتێك دەبێتە ئاوێنەیەك کە تیایدا یەکێك لە سیفەتە لە ژمارە نەهاتووەکانی بوون ڕەنگی داوەتەوە. شاعیر گوێ بۆ دەنگی پێی ئاو ڕادەگرێت، خواکەی ئەوەتا لەسەر وریایی ئاو، لە خاڵەکانی باڵی پەپوولە و تێپەڕبوونی مێشولەیەك بە کۆلأنی تەنیاییدا ڕادەمێنێت.. سەرنجی شاعیرانەمان بۆ لای ئەو ئەو پەیوەندیانە ڕادەکێشێت کە چاوی ئاسایی، کە هەستکردنی مرۆڤی ئاسایی تێیان ناگات. ئەمەش ئەم تێڕوانینیە تازەیەیە کە لەمەو پێش لە شیعری فارسیدا نەبووە: لە بەر ئەوەی شیعری کلاسیکی فارسی زیاتر بەلای سۆز و مەعنەوییوونی حاڵەتە دەروونییەکاندا ڕۆشتووە تاکو بەلای ئەو هەستکردنە جوانەدا کە شتەکانی دەوروبەر دەیسەپێنێت[9]

خاڵێکی دی کە بەردەوام سپێهری بە هۆی ئیستعارە و دەربڕینی ناسکی شاعیرانەوە باسی لێوەدەکات، مەسەلەی مەرگە. ئەگەر لەلای شاعیر و فەیلەسووفێکی گەورەی وەك خەییام، مەرگ سنورێك بێت لە نێوان جیهانی واقیع و دنیای مەرگ خۆیدا،

[9] سەرچاوەی یەکەم، ل: 41-42



خەییامیش بەردەوام پێ لە سەر خۆشی و چێژەکانی پێش مەرگ دابگرێت، ئەوا لەلای سپێهری مەرگیش ئەزموونێکە مرۆڤ پیایدا تێپەڕ دەبێت. بەڵکو مەرگ زیاتر خۆی لە ژیان جیانابێتەوە.

لە تێکستە بوداییەکاندا مەرگ ئامانجە. بوداییەکان مەرگی ڕاستەقینە بەو مەرگە دەزانن کە ئیدی زیندووبونەوەی لە دوا نەبێت و مرۆڤ لە مەداری بوون بچێتە دەرێ. واتە مەرگ خۆی ئەزموونێکی گەورەیە لە دڵی ژیاندا، هەر وەك بودا بە خەڵکە ڕەشۆکەکەی دەگوت: ئەو هێزانەی کە دروستکەری مرۆڤ و گیانلەبەرەکانی دیکەن، جا ئەوانە هێزە مادییەکان بن یاخود هێزە ڕۆحی ومەعنەوییەکان، بەردەوام خۆیان لە حاڵەتی گۆڕانکاری و جوڵەدان، بەم مانایەش مەرگ ئەزموونی هەر چرکەیەی ژیانی مرۆڤەکانە[10]

سپێهری دەڵێت:

مەرگ کۆتایی کۆترەکان نییە
مەرگ لە ئاو و هەوای سازگاربیردا هێلانەی کردووە
مەرگ لە خودی شەوگاری گوندا، باسی سپیدە دەکا
مەرگ لەگەڵ هێشووی ترێدا خۆی داوێتە دەمانەوە
گاهێ لە سێبەردا ڕۆنیشتووە و لە ئێمە دەڕوانێ

[10] راە حق ل:19

هەمووشمان دەزانین:
سییەکانی خۆشبەختی پڕن لە ئۆکسجینی مەرگ.

لە دەنگی پێی ئاودا سپێهری باسی خۆیمان بۆ دەکات: خەڵکی کاشانم، رۆژگارم دەگوزەرێ، من موسڵمانم ... ئەم دەستپێکردنە دەستی خوێنەر دەگرێت بۆ ئەوەی بە ئاسانی بە بێئەوەی بیری خۆی بە لێکدانەوەی دەربرینی قورسەوە خەریك بکات، وێنەیەکی سپێهری لە زەینی خۆیدا بکێشێت. بەلاّم شاعیر لە پڕ دەست دەکات بە ئاشکراکردنی مەبەستە سەرەکیەکەی، کە دۆزینەوەی ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆیەتی:

ڕەنگە ڕەچەڵەکم بچێتەوە سەر گیایەك لە هیندستان
بچێتەوە سەر قاپێکی قوڕین لە خاکی "سیەلك"
ڕەنگە ڕەچەڵەکی من بچێتەوە سەر سۆزانیەکی شاری بوخارا..

پاشان دەبێتە میوانی دنیا، لە سەر زەوی زۆرشت دەبینێت، لە بەردەمی هەر شتێکدا هەڵوێستەیەك دەکات. بەلاّم لە هیچ جێگەیەکی ئەم جیهانەدا هەواری ڕاستەقینەی نادۆزێتەوە. لێرەشەوە نامۆبوونی سپێهری بە قووڵی دێتە ڕوو:

خەڵکی کاشانم، وەلێ



شاری من کاشان نیە
شارەکەی من گوم بووە.

شیعرەکە دوو بەشی درێژە، لە یەکەمیاندا سپێهری بە زمانێکی شاعیرانە دەکەوێتە ئاشکراکردنی کۆمەڵێك دەنگ و ڕەنگی عارفانە لە سرووشتدا، ڕەهەندی عارفانە دەداتە مێروولە و شەپۆل و وشە. بەلاّم لە بەشی دووەمدا هەوڵی سپێهری وەك داریوش شایگان دەڵێت: "بەڕۆحانیکردنی مادیاتەکانە".
لەم بەشەدا پەنجەرەی ڕۆحی شاعیر لە ڕووی فەزادا دەکرێتەوە و بانگهێشتمان دەکات بۆ لادانی ئەو پەردەیەی خەریکە هەستمان دەحنکێنێت و دەستی ناوەتە گەرووی بیرکردنەوەمان:

پەردە لابدەین
ڕێ بدەین با هەست هەوایەك هەڵمژێ.
ڕێگە بدەین غەریزە عەودالّی یاریی بێت.
ڕێگە بدەین تەنیایی ستران بچڕێ،
شت بنووسێ
بچێتە سەر شەقام، پیاسەبکات.

شیعری سپیهری پڕن له وێنهی جوان. ئهم وێنانه بهرههمی ئهزموونی سۆزی تاکهکهسین و له جیهانی نهمرییدا سوکنایی به دڵی خوێنهر دهدهن. له پشت ههر وێنهیهکهوه مرۆڤێکی عارف دانیشووه و بهو پهڕی ڕاستگۆییهوه بیروڕای خۆیمان له مهڕ بوونهوه به شێوهیهکی ئاشکرا و ڕوون بۆ باس دهکات[11]. ئهزموونی سپیهری ئهزموونی ژیانه به دڵ و دهروونێکی پاك و دوور له گرێ وگۆڵی دنیای پیشهسازی کارگه و شاره گهورهکان. ئهزموونی ڕێبوارێکی کۆچهره له دنیای رۆحدا و ههواری پشوودانیشی، "مهنزڵی یار"ه.

سپیهری یهکهم دیوانی خۆی له تهمهنی بیست و سێساڵیدا به ناوی (مرگ رنگ)هوه چاپکردووه. ههروهکو سیروس طاهباز دهڵێت، شاعیر لهم دیوانهدا له ژێر کاریگهریی نیمایوشیج دایه. بهڵام له دیوانی دووهمدا که دووساڵ دوای مهرگی ڕهنگ، چاپکراوه، سپیهری دهستدهکات به گێڕانهوهی ئهزموونی ژیانی خۆی، (ژیانی خهونهکان) که ناوی دیوانهکهیه، دهکرێ وهکو ئهو زهمینهیه تهماشای بکرێت که سپیهری شوێنپێی شیعری خۆی له سهر قاییم کردووه.(آوار آفتاب)، سێهم دیوانی شاعیره که ساڵی(1961)چاپکراوه. سپیهری لێرهدا دهزووی هاوپهیوهندێتی مرۆڤ و سروشت دهدۆزێتهوه ئیدی به درێژایی

[11] سهرچاوهی یهکهم، ل:48



ئهزموونهکهی ههوڵی پتهوکردنی ئهم بنهمایه دهدات، فهروغی فهروغزاد له بارهی ئهم دیوانهوه دهڵێت: سوهراب سپیهری له دوابهشی (آوار آفتاب)هوه دهکهوێتهوه ڕێ، به شێوهیهکی زۆر تازه و سهرسووڕهێنهر دهکهوێته ڕێ، ههر بهوجۆرهش بهردهوامی وهردهگرێت و پێشدهکهوێت. سپیهری له ههموان جیاوازتره، جیهان و بیری ئهو بهلای منهوه سهرنج ڕاکێشترین جیهانه. ئهو باسی مرۆڤ و ژیان دهکات ههر له بهر ئهوهیشه ئهو فراوانه. له مهڕ کێشی شیعریشهوه، ڕێگهی خۆی دۆزیوهتهوه. ئهگهر ههموو تواناکانی خۆی بۆ شیعر دهخسته کار ئهو کاته دهیزانی به کوێ دهگات[12].

ساڵی (1987) چاپی شهشهمی سهرجهمی بهرههمهکانی سپیهری به ناوی (ههشت کتێب)هوه کهوته بازاڕهوه. ئهم کتێبه جگه لهو سێ دیوانهی پێشتر ناومان بردن، پێنج کۆمهڵه شیعری دیکهش له خۆی دهگرێت: خهمی خۆرههڵات 1961، دهنگی پێی ئاو 1965، کۆچهر 1966، بارستایی سهوز 1967 و ئێمه هیچ ،ئێمه نیگا.

شیعری (دهنگی پێی ئاو)م له بهر ڕۆشنایی چهند تێکستێکدا کردۆته کوردی. له وانهش ئهو دهقهی له کتێبی (سپهری، شاعر نقاش)دا چاپکراوه. ههروهها لهگهڵ ئهو دهقهشدا بهراودم کردووه که (پرویز

[12] ههر ئهوێ، ل:47

شکیبایی) بە دەنگی خۆی لە سەر کاسێت دەیخوێنێتەوە. پاشانیش لەگەڵ ئەم دەقەدا کە لە هەشت کتێب دا چاپکراوە بەیەکم گرتوون.
بەڵام من زیاتر پشتم بە کاسێتەکە و هەشت کتێب بەستووە.
دواجار حەز دەکەم لە ڕووی وەفادارییەوە سوپاسی زۆرم بە هەموو ئەو برادەرانە پێشکەش بکەم کە تێبینی خۆیان لە سەر وەرگێرانەکەی من نووسیبوو. هەروەها سووپاسی زۆرم بۆ کاك بورهانی ئەییوبی و کاك فەرهاد ،کە یەکەمیان لە پێداچوونەوەی دەقە فارسییەکەدا یارمەتیدام و دووەمیشیان لە برینی ئەم بەرهەمەدا خۆی ماندووکرد.
دوا وتە: دەمەوێت بەو پەڕی دڵفراوانییەوە ئەم نامێلکەیە پێشکەش بە خوێنەری کورد و کتێبخانەی ئاوارەی کورد بکەم، بە ئومێدی ئەوەی بە تێبینی و ڕەخنەکانیان بەرهەمەکە زیاتر دەوڵەمەند بکەن.
ڕێبوار.س، هاوینی1989
کۆبنهانگن

## دەنگی پێی ئاو

خەڵكی كاشانم[13]
ڕۆژگارم دەگوزەرێ..
لەتێك نانم هەیە و كەمێك هۆش و
هێندەی سەری دەرزیەكیش زەوق.
دایكێكیشم هەیە چاكترە لە گەڵای درەخت
هاوڕێكانیشم، چاترن لە ئاوی سازگار.

خوایەكیش ئەوەتا لەم نزیكانەیە:
لای ئەو شەوبۆیانەوە، لە بن ئەو سنەوبەرە بەرزەدا
لەسەر ئاگایی ئاو.. لەسەر یاسای سەوزەگیا..

[13] كاشان: ناوی شارێكە لە ئێران و شوێنی لەدایكبوونی شاعیرە.



من مسوڵمانم.
قبیلەم گوڵێكی سوورە،
جێ نوێژم: كانی، بەردەمۆرم: نوور.
سارا بەرماڵی منە.
من دەستنوێژ بە خووڕپەی پەنجەرەكان دەشۆم
لە نوێژەكانمدا، مانگ ڕەوانە، شەبەنگ دیار
بەرد لەو دیو نوێژەكانمەوە دەبینرێ:
هەموو زەڕاتی نوێژەكانم دەبریقێنەوە.
من كاتێك نوێژ دەكەم
كە با، لەسەر چڵی سەروەدارەوە بانگی گوتبێ.
من لە دوای "تكبیره الاحرام"ی ئاڵفەوە[14] نوێژ دەكەم
بەدوای "قدقامت"ی شەپۆلەوە.
كەعبەم لە قەراخی ئاوە.
كەعبەی من ئەوەتا لە ژێر داری ئەكاكیادایە

[14] ئاڵف، علف: تفاق، ئەو گیایەی دەدرێ بە ئاژەڵان.

کەعبەی من وەك شەونم، باخ بە باخ..
شار بە شار دەڕوات
"حجر الاسود"ی من: ڕووناکایی باخچەیە.

خەڵکی کاشانم
پیشەم نیگارکێشانە
جار جارە قەفەسێك دروستدەکەم بە ڕەنگ،
دەیفرۆشم بە ئێوە
تا بە هۆی ئاوازی گوڵاڵە سوورە زیندانیەکەی ناوێوە
دڵی تەنیاتان تازەبێتەوە.
چ خەیاڵێکە، چ خەیاڵێك، .. دەزانم
پەردەی نیگارەکانم بێگیان و
باش دەزانم ئەستێرکی[15] تابلۆکەشم: بێ ماسی..

[15] ئەستێرك: بە سەرچاوەی ئاوێکی کەم دەگوترێ، کە بەردەمەکەی کرابێتە گۆم و ئاوەکەشی کەم بێت و ئەگەری وشکبوونیشی زۆرە. سپێهری وشەی (حوض) بەکاردەهێنێ، بەڵام من ئەستێرکم پێجوانتر و شاعیرانەتر بوو.



خەڵکی کاشانم
ڕەنگە ڕەچەڵەکم بچێتەوە سەر گیایەك لە هیندستان
بچێتەوە سەر قاپێکی قوڕین لە خاکی سیەلك[16]
ڕەنگە، ڕەچەڵەکی من بچێتەوە سەر
سۆزانییەکی شاری بوخارا[17]

باوکم لە دوای دووجار هاتنی پەڕەسێلکەکانەوە،
لە دوای دوو بەفری چلەوە،
لە دوای دوو خەولێکەوتن لەبەر مانگەشەو،
باوکم، لە مێژە مردووە.
کاتێك باوکم مرد، ئاسمان شین بوو
دایکم بێئاگا لە خەو ڕاپەڕی، خوشکەکەم جوان بۆوە.

[16] سیەلك: یەکێکە لەناوچە دێرینەکانی خوارووی ڕۆژئاوای کاشان.
[17] بخارا، بوخارا: شارێکی گەورە و کۆنی مێژووییە و ئێستا بەشێکە لە کۆماری ئۆزبێکستان.

باوكم كاتێ مرد، پاسەوانەكان گشتیان شاعیر بوون.
كابرای میوەفرۆش لێی پرسیم:
چەند مەن[18] كاڵەكت دەوێ؟
منیش لێم پرسی: دڵێكی خۆش سیری[19] بەچەند؟

باوكم نیگاركێشی دەكرد
سازی لێدەدا و سازیشی دروستدەكرد
خەتێكی جوانیشی بەلاوە بوو.

باخچەكەی ئێمە كەوتبووە لای سێبەری داناییەوە
باخی ئێمە جێژوانی گرێبەستی سەوزایی و هەستەوەری،
باخی مە شوێنی بەیەك گەیشتنی
نیگا و قەفەس و ئاوێنە بوو.

[18] من، مەن: یەكەیەكی كێشانەیە و دەكاتە سێ كیلۆ.
[19] سیر(sir): یەكەیەكی كێشانەیە و دەكاتە 75 گرام.



باخچەكەی ئێمە،
لەوە دەچووكەوانەیەك بێت
لە بازنەی سەوزی خۆشبەختیدا.
ئەو ڕۆژگارە، میوەی كاڵی خوداییم لە خەونمدا دەجوو
ئاوم بەبێ فەلسەفە دەخواردەوە
بەبێ زانین، تووم دەوەراند..
تا هەنارێك دەقڵیشا، دەستم دەبووە فوارەی پاڕانەوە
تا چۆلەكەیەك دەیخریواند،
وەخت بوو گیانم لە زەوقی گوێگرتن بسووتێ
گاهێ تەنیاییش،
ڕووخساری دەنا بەودیو پەنجەرەكەمەوە
شەوق دەهات، دەستی دەكردە ملی هەست.
هزر، گەمەی دەكرد
ژیان شتێ بوو. وەك ڕشێنەبارانێكی جەژنان،
وەك چنارێكی پڕ لە باڵدار

ژیان لـەو دەمەدا،
ڕیزێك بووكەشوشە و چەپكێ ڕوناكی بوو.
یەك باوەش ئازادی بوو
ژیان لـەو سەردەمەدا: حەوزێ مۆسیقا بوو.

بە ئەسپایی، مندالّی لـە گەرەكی پووشكەبەقوونەكان[20]
هێدی هێدی دووركەوتەوە
باری خۆم لـێنا و لـە گەڕەكی خەیالّـەخاوەكان چومەدەر
دلّیشم لـە تاو غوربەتی پووشكەبەقوونەكان: پڕ

من چوومە میوانداریی دنیا
بەرەو دەشتایی خەم،
من بەرەو باخی عیرفان

[20] پووشكەبەقوونە: جۆرێكە لە بالّدار، كلكێكی درێژ و دووبالّی ڕەنگاوڕەنگی هەیە و لە گوێ شیو و نزیك شینكایەتی دەژی. مندالاّن دەیانگرن و پووشكەیەك ڕۆدەكەنە كلكیانەوە و بەرەللاّیان دەكەن و دەفڕنەوە.



بەرەو هەیوانی پڕچرای زانست چووم.
بە پلـەی مەزهەبدا چوومە سەرێ.
تا كۆتایی كوچەی گومان
تاكو هەوای فێنكی بێنیازی،
تاكو شەوی تەڕوبڕی خۆشەویستی، ڕۆیشتم.
چووم بۆ بینینی كەسێ لـەو پەڕی عەشق
ڕۆیشتم، ڕۆیشتم هەتا ژن،
تا چرای لـەززەت
تا بێدەنگیی تكا
هەتا سەدای پەڕی تەنیایی

چ شتگەلـێكم بینین لـەسەر زەوی:
مندالّێكم دی بۆنی دەكرد بە مانگەوە
قەفەسێكی بێدەرگام دی،
تیایدا ڕۆشنایی بالّـە فڕەی بوو.

**پەیژەیەکم دی،**
**لێوەی عەشق سەر دەکەوتە سەر بانی مەلەکوت**[21]
**ئافرەتێکم دی، لە دەسکەوانێکدا ڕووناکی دەکوتا**
**نیوەڕۆش سفرەکەیان نانی لەسەر بوو،**
**سەوزە، دەورییەك شەونم و**
**قاپێکی داغ خۆشەویستیشی لەسەر بوو**
**من دەرۆزەکەرێکم دی،**
**دەرگا بە دەرگا دەرۆیشت و**
**نەغمەی بولبولی سواڵ دەکرد،**
**کەنناسێکم دی بۆ تێکولّە کالّەکێ نوێژی دەکرد.**

**بەرخێکم دی، کۆلارەیەکی دەجوو**
**ولاخێکم دی، لە وێنجە**[22] **تێدەگەیشت**

[21] ملکوت، مەلەکوت: زاراوەیەکی تەسەووفە و بەو جیهانە دەڵێن کە تایبەتە بە بوونی ڕەها و نیشنگەی حەقق و مەعنا و نوورە.



**لە بژوێنی "ئامۆژگاری"دا، گایەکم بینی: تێر**

**شاعیرێکم دی لە کاتی قسەکردندا،**
**بە گوڵی سەوسەنی دەگوت: "ئێوە".**

**من کتێبێکم دی، سەراپای وشەکانی بلووری**
**کاغەزێکم دی، بەهاری**
**مۆزەیەکم دی، دوور لە سەوزایی**
**مزگەوتێکی دوور لە ئاو**
**لە سەر بالیفی فەقێیەکی نائومێد،**
**گۆزەیەکم دی لێوڕێژ لە پرسیار**

**ئێسترێکم بینی بارەکەی "پەخشان"**

[22] وێنجە: جۆرێکی گیایە، کە لە جوانی و بۆنخۆشی خاڵی نییە. بەتایبەتی دەچێنرێ و لە شێوەی سێپەڕەدایە و زووزووش دروێنە دەکرێ.

وشترێکم بینی بارەکەی
سەبەتەیەکی بەتاڵ: "پەندو ئامۆژگاری".
عارفێکیشم بینی بارەکەی: "هایی و هوو".

شەمەنەفەرێکم دی ڕۆشنایی دەبرد
شەمەنەفەرێکم دی فیقهی دەبرد و
چەندە سەنگین دەڕۆیی
شەمەنەفەرێکم دی سیاسەتی دەبرد و
چەندە بەخاڵی دەڕۆیی
شەمەنەفەرێکم دی
تۆی لاولاو و ئاوازی کەناری دەبرد
فڕۆکەیەکیش، لە بەرزیی هەزاران پێوە
هێشتا لە پەنجەرەکانیەوەی زەوی دیار بوو:
پۆینەی پەپوولەکانە،
خاڵەکانی باڵی پەپوولە و



وێنەی بۆقێك لە ناو ئەستێرکدا
تێپەرینی مێشوولەیەك بە کۆڵانی تەنیاییدا
پاڕانەوەی ئاشکرای چۆلەکەیەك،
کاتێك لە سەر چنارێکەوە دەفڕێتە سەر زەوی
باڵقبوونی خۆر و
باوەش پێداکردنی بووکەشووشە بە کازیوەدا..

ئەو پلیکانانەی دەچوونەوە سەر گوڵخانەی شەهوەت
ئەو پلیکانانەی دەچوونەوە ناو سەردابی ئەلکولەوە
ئەو پلیکانانەی بەرەو یاسای ئابڕوبردنی گوڵی سوور و
تێگەیشتنی ماتماتیکیانەی ژیان دەڕۆیشتن
ئەوانەی بۆ بانیژەی ئیشراق و
ئەوانەی دەچوونەوە سەر سەکۆی توانەوە

دایکیشم لەو خوارەوە

پیاڵەكانی لـە بیرەوەری دەریادا دەشتن

شار دیار بوو
بەرزبوونەوەی هەندەسیانەی ئاسن، چیمەنتۆ، بەرد
سەقفی بێ كۆتری سەدان نەفەربەر
گوڵفرۆشێك گوڵەكانی هەڕڕاج دەكردن
لـە نێوان دوو ئەرخەواندا
شاعیرێك جۆلانەی هەڵخست
كوڕێ دیواری قوتابخانەی بەرد باران كرد
منداڵێ
دەنكە قۆخێكی تف دەكردەوە
سەر بەرماڵی بێڕەنگی باوكی..
بزنێكیش لـە "خەزەر"[23]ی نەخشەی جوگرافیادا،
ئاوی دەخواردەوە

[23] خزر، خەزەر: دەریای خەزەر



تەنافێك دیار بوو: مەمكەوانێكی بێ ئۆقرە

تایەی گارییەك لـە حەسرەتی دۆشدامانی ئەسپ
ئەسپێك لـە حەسرەتی خەوتنی گاریچی،
كابرای گاریچیش لـە حەسرەتی مەرگ.

عەشق دیاربوو، شەپۆل دیاربوو
بەفر دیار بوو، دۆستی دیاربوو
وشە دیار بوو
ئاو دیاربوو، وێنەی شتەكان لـە ئاودا
سێبەری فێنكی خرۆكەكان لـە كەفی خوێندا
بەشی شێداریی ژیان
خۆرهەڵاتی
كانگای ئازەرەكانی مرۆڤایەتی

وەرزی سەرگەردانی بە کۆڵانی ئافرەتدا
بۆنی تەنیایی لە کوچەی وەرزدا

لە مشتی هاویندا، باوەشێنێك دەبینرا!

سەفەری تۆو بەرەو گڵ
سەفەری ئەم ماڵەوماڵی گیاکەڵە
سەفەری مانگ بەرەو کانی
پڕژانی گوڵی حەسرەت لە زەوی
هاتنە خوارەوەی خەڵفی مێو بە داردا
بارینی شەونم بەسەر پردێکی خەواڵوودا.
بازهەڵدانی شادی لە خەندەقی مەرگەوە
تێپەڕینی ڕوداو بە دوای قسەدا.
شەڕی کلاوڕۆژنە و تکای هەتاو
شەڕی پلیکانەیەك لەگەڵ پێی بەرزی خۆر



شەڕی تەنیایی لەگەڵ ئاوازێ
شەڕی جوانیی هەرمێکان
لەگەڵ بەتاڵیی زەمبیلەیەکدا
شەڕی خوێناوی هەنار و ددان
شەڕی "نازییەکان" لەگەڵ لقێ نازناز
شەڕی تووتی و ڕەوانبێژی
شەڕی نێوچەوان لەگەڵ ساردی بەردەمۆردا.

هێرشی کاشیی مزگەوت بۆ سجود
هێرشی با بۆ سەر میعراجی بڵقی سابوون
هێرشی سوپایەك پەپوولە
بۆسەر بەرنامەی "لەناوبردنی ئافات"
هێرشی دەستەیەك پووشکەبەقوونە
بۆ سەر ڕیزی بۆریچییەکان..
هێرشی سوپای ڕەشی قامیشەقەڵەم

بۆسەر پیتە زیوییەکان
هێرشی وشە بۆ چەناگەی شاعیر.

فەتحی یەك سەدە بە دەستی شیعرێك
فەتحی باخچەیەك بە دەستی ڕەشیشەیەك
فەتحی کۆلانێك بە دەستی دوو سلاو
فەتحی شارێك بە دەستی سێ چوار ئەسپسواری دارینە
کردنەوەی ئاهەنگێك
بە دەستی تۆپێك و دوو بوکە شوشە

کوژرانی فیقفیقەیەك لە سەر دۆشەکی پاشنیوەڕۆ
کوژرانی چیرۆکێك لە سەرەتای کۆلانی خەودا
کوژرانی خەمێك بە فەرمانی سروود
کوژرانی تریفەی مانگ بە فەرمانی نیۆن[24]

[24] مەبەست لە چرای نیۆنە.



کوژرانی داربییەك بە دەستی دەولەت
کوژرانی شاعیرێکی ژاکاو بە دەستی گوڵی سوور
سەراپای زەوی دیاربوو
تەبایی بە کوچەی یۆناندا دەڕۆی
کوندەپوو لە "باخچەی هەڵواسراو" دەیخوێند
با، لە لوتکەی خەیبەرەوە،
مشتێ چڵ و چێوی مێژووی بەرەو خۆرهەلات ڕادەپێچا
بە سەر دەریای ئارامی (نگینە)دا[25]،
بەلەمێك گوڵی دەپەڕاندەوە.
لە سەری هەر کۆلانێکی شاری "بنارس"[26]،
چرایەکی ئەبەدی هەڵکرابوو..

خەڵکانێکم دیتن

[25] نگین، نگینە: شارێکە لە نزیکی هیمالایای هیندستان.
[26] بنارس: شارێکە لە هیندستان و لە ڕۆخ ڕووباری (گنگ)، سەنتەرێکی کەلتووری و شاری پیرۆزی بەرەهمەنەکانە (واتە: ڕۆحانییەکانی هیندستان).

شارانێکم دیتن،
دەشتەکان و چیاکانم بینین
ئاوم بینی، خاکم بینی
ڕووناکی و تاریکیم بینی
گژوگیام لە ڕووناکیدا و گژوگیاشم لە تاریکیدا بینی
گیانەوەرم لە ڕووناکیدا و گیانەوەریشم لە تاریکیدا بینی
مرۆڤم لە ڕووناکیداو مرۆڤیشم لە تاریکیدا بینی.

خەڵکی کاشانم، وەلێ
شاری من کاشان نیە.
شارەکەی من گوم بووە.
من بە هەدادان، بە تا،
خانویەکم لەلایەکی دیکەی شەوگارەوە دروستکردووە.

من لەو خانووەدا



نزیکم لە گومناویی شێداری گژوگیاوە
من دەنگی هەناسەدانی باخچە دەبیستم
دەنگی تاریکیش دەبیستم،
کاتێ لە گەڵایەکەوە بەردەبێتە خوار.
دەنگی کۆکەی ڕووناکاییش، لە پشت دارەوە،
دەنگی پژمینی ئاو لە درزی هەر بەردێکدا و
جیکەجیکی پەڕەسێلکە لە ئاسمانی بەهارەوە.
دەنگی ئاشکرای کردنەوە و پێوەدانی پەنجەرەی تەنیایی.
دەنگی داماڵینی تەواوەتی کاژی ئاڵۆزکاوی عەشق
کەڵەکەبوونی زەوقی فڕین لای باڵ
دەق شکانی ترسی ڕۆح.
من دەنگی پێی تکا دەبیستم و
دەنگی، یاسایی خوێن لە دەمارەکاندا.
لێدانی سەحەریانەی بیری کۆترەکان،
دڵە تەپێی شەوانی هەینی!

تێپەڕینی گوڵەمێخەك بە هزردا
حیلەی ئاشکرای حەقیقەت لـە دوورەوە.
من دەنگی گیزەی ماددەم گوێ لێیە و
دەنگی پێڵاوی ئیمانیش لـە کوچەی حەزدا
دەنگی دڵۆپی بارانیش، لـە سەر برژانگی تەڕی عەشق
لـە سەر مۆسیقای خەمناکی باڵقبوون
لـە سەر ئاوازی باخە هەنارەکان
دەنگی پڕژانی شووشەی شادی لـە شەودا
لـەتوپەتبوونی کاغەزی جوانی
پڕ و خاڵیی بوونەوەی پەرداخی غوربەت لـە"با".

من لـە سەرەتای عەردەوە نزیکم
لێدانی دڵی گوڵـەکان دەگرم
لـە چارەنووسی تەڕی ئاو
لـە خووی سەوزی درەخت، شارەزام



ڕۆحی من بە قوژبنی تازەی شتەکاندا دەڕوا
ڕۆحی من کەم تەمەنە.
ڕۆحی من جاری وا هەیە لـە خۆشیان،
کۆکەی لێدەپژێ..
ڕۆحی من بێکارە:
دڵۆپی باران و درزی خشتەکان دەژمێرێ
جاری وایە ڕۆحی من،
وەك بەردێکی سەرەڕێ حەقیقەتی هەیە.

من دوو سنەوبەرم نەم دیوە دوژمنی یەك بن
نەمدیوە بییەك سێبەری خۆی بفرۆشێ بە زەوی
نارەوەن[27] بە خۆڕایی لقی خۆی دەداتە قەلـەباچکەکان
لـە هەر جێیەك گەڵایەك هەبێ، زەوقی من دەکرێتەوە
پنجکی خەشخاش[28] لـە لافاوی بووندا شتومیەوە.

[27] نارون، نارەوان، نارەوەن: درەختێکی کورتەباڵایە و گوڵێکی سادەی جوان دەردەکات.

وەك باڵی مێروولـە كێشی سپێدان دەزانم
وەك گوڵدانێ، گوێ بۆ مۆسیقای ڕووان دەگرم.
وەك زەمبیلـەیەكی پڕ لـە میوە،گەرمیی گەیینم تێدایە!
وەك مەیخانەیەك وام لـە سنووری تەمبەڵیدا.
وەك باڵاخانەیەكی كەنار دەریا، نیگەرانم
بە چڕبوونەوە درێژی هەورەكان

تا بتەوێ خۆر، تا بتەوێ پەیوەندی و تا بتەوێ فرەیی
من بە سێوێك دڵخۆشم و
بە بۆنكردنی پنجی زەردەگوڵ
من بە ئاوێنەیەك، بەیەك پەیوەندی خاوێن قەناعەتم هەیە
بە تەقینی میزەڵدانێك پێناكەنم.
پێكەنینیشم نایەت ئەگەر

[28] خشخاش، خەشخاش: گیایەكی دوو گەڵایە، كە لە شیراوەكەی مادەی تریاكی لێدەردێت.



فەلسەفەیەك، مانگ بكات بە دوولـەتەوە[29]
من دەنگی باڵی سوێسكەكان دەناسمەوە
ڕەنگی ژێر سنگی داڵـە كەرخۆرەكان
شوێن پێی بزنە كێویەكان.
باش دەزانم ڕێواس لـە كوێ دەڕوێ،
ڕەشیشەكان كەی دێن، كەو چ كاتێ دەخوێنێ،
باز كەی دەمرێ.
مانگ لـە خەونی بیاباندا چیە.
مەرگ لـە لاسكی تكادا
توترِكی لـەززەت لـە ژێر ددانی پێكەوەخەوتندا.

ژیان خوێكی خۆشە!
پەڕوباڵی ژیان هێندەی فراوانی مردنە،

[29] پێدەچێ ئاماژە بێت بە ئایەتی (إقتربت الساعة و إنشق القمر. وإن يرو آية يمرضوا ويقولوا سحر مستمر). قورئانی پیرۆز، سورەی قمر، كە باس لە موجیزەكانی پەیامبەر دەكات.

فڕینێکی هەیە بە ئەندازەی عەشق.
ژیان شتێك نیە،
لە لێواری تاقی عادەتدا لە یادی من و تۆ بچێ
ژیان جەزبەی دەستێکە میوە دەچنێ
ژیان نۆبەرەی هەنجیرە ڕەشەیە لە زاری ترشاوی هاویندا
ژیان، بەرزی درەختە بە چاوی مێروولە.
ژیان ئەزموونی شەمشەمەکوێرەیە لە تاریکاییدا
ژیان هەستی غەریبایەتی باڵندەیەکی کۆچەرە
ژیان بۆقی شەمەنەفەرێکە،
کاتێ خۆی لە خەونی پردێکەوە دەئاڵێنێ.
ژیان دیتنی باخچەیەکە
لە پەنجەرەی کڵۆمدراوی فڕۆکەیەکەوە
هەواڵی ڕۆیشتنی ساروخە بۆ ئاسمان
هەستکردنە بە تەنیایی مانگ
بیرۆکەی بۆنکردنی گوڵێکە: لە ئەستێرەیەکی دی.



ژیان شتنی قاپێکە.

ژیان دۆزینەوەی ئانەیەکە لە جۆگەی شەقامدا
ژیان ڕەگی ئاوێنەیە.
ژیان بریتییە لە گوڵ بە توانی ئەبەدیەت
ژیان کەرەتی زەوییە، لە لێدانی دڵەکان
ژیان هەندەسەی سادە و یەکسانی هەناسەکانە.

لە هەرجێیەك بم، هەم
ئاسمانماڵی منە.
پەنجەرە، بیر، هەوا، عەشق، زەوی ماڵی منە
چمداوە لەوەی گەر جاروبار
دەڕوێن کوارگەکانی[30] غوربەت؟

[30] کوارگ: قارچك، کارگ.

من نازانم بۆچی دەڵێن:
ئەسپ ئاژەڵێکی بەڕیزە و کۆتر جوانە؟
بۆچی لە قەفەسی کەسیکدا هەڵۆیەك نابینم؟
سێپەڕە چی لەگوڵاڵەسوورە کەمترە؟
دەبێ چاوەکان بشۆین و جۆرێکی دی ببینین
دەبێ پەیڤەکان خاوێنکەینەوە.
دەبێت پەیڤەکان خۆیان با
خۆیان باران بن.
دەبێت چەترەکان داخەین،
بەژیر باراندا ڕیکەین..
دەبێ هزرین و یادوەریمان ببەینە ژێر بارانەوە
لەگەڵ گشت خەڵکی شاردا بە ژێر باراندا بڕۆین
دەبێ لەژێرباراندا بۆ دۆستەکانمان بگەڕێین
لە ژێر باراندا بۆ عەشق بگەڕێین



لەژێرباراندا لەگەڵ ئافرەت بخەوین
لە ژێر باراندا یاری بکەین.
لە ژێر باراندا بنووسین، قسان بکەین، نیلۆفەڕ بچێنین
ژیان تەڕبوونی بەردەوامە،
ژیان مەلەکردنە لە ئەستێرکی هەنووکە دا.

جلەکانمان دابکەنین
تا ئاو، هەنگاوێکە..
تامی ڕۆشنایی بکەین
شەوی گوندێك وەزن کەین، خەونی ئاسکێك..
تێبگەین لە گەرمی هێلانەی لەقلەق
پێ نەنێین بە یاسای چەمەندا
لە ڕەزدا گرێی چێژ بکەینەوە
کاتێك مانگ هەڵهات زار بکەینەوە.
نەشڵێین شەو شتێکی خراپە،

نەڵێین گوڵئەستێرە لـە جیهانبینی باخچە تێناگات

با سەبەتەیەك بهێنین و
ئەم هەموو ئەرخەوانییە، ئەم هەموو سەوزاییە ببەین.

بەیانیان نان و پەنیرەك[31] بخۆین و
لـە پێچی هەر قسەیەكماندا نەمامێك بڕوێنین
لـە نێوەندی دوو دەنگدا تۆوی بێدەنگی بچێنین.
ئەو كتێبانە موتالاَ نەكەین، با تیایاندا هەڵناكات
ئەو كتێبەش تیایدا پێستی شەونم تەڕ نیە
كتێبێك كە تیایدا خرۆكەكان بێمەودان.
خۆزگە نەخوازین
مێش بفڕێ لـەسەر پەنجەی سروشت!
خۆزگە بۆ مەرگی پڵنگ نەخوازین

[31] پنیرك، پەنیرەك: گیایەكی خۆڕسكە و بەرزاییەكەی دەگاتە نزیكەی 30 تا 60سم.



بزانین، ئەگەر كرم نەبایە ژیان شتێكی كەم دەبوو.
ئەگەریش هەڕیە نەبایە یاسای درەخت زیانی پێدەگەیی
گەر مەرگ نەبایە،
دەستی مە بەدووی شتێكدا وێڵ دەبوو
بشزانین ئەگەر ڕووناكی نەبایە
مەنتیقی زیندووی فڕین دەگۆڕا
بزانین بەر لـە پەیدابوونی یاقوت،
لـە هزری دەریاكاندا بەتاڵی دەبینرا.
نەشپرسین ئێمە لـە كوێین؟
بۆن بكەین بە گوڵـە مەخمەڵی تازەی نەخۆشانەوە
پرسیار نەكەین فوارەی بەختمان لـە كوێیە.
نەپرسین باوكی باوكان
چ شەونم و كامە شەویان بەڕێكردووە.
لـە رابرِدوودا دنیای زیندو بەدی ناكرێ
لـە رابرِدوودا باڵندە ناخوێنێ

لە رابرِدوودا با تێپەرِ نابێ
لە رابرِدوودا پەنجەرەی سەوزی سنەوبەر کڵۆم دراوە
لە رابرِدوودا سەراپای مەرِمەرِەکان
تەپوتۆز داپۆشیون
لە رابرِدوودا ماندوویی مێژوو دەبینرێ.
لە رابرِدوودا یادەوەری شەپۆلەکان،
سەدەفی ساردوسرِ بەرەو کەنار رِادەپێچن.

وەرن با برِۆینە کەنار دەریا،
تۆرِ هەڵدەینە نێو ئاوەوە و
تەرِوبرِی لە ئاوی دەریا بخوازین.

بەردەچەوێك لە عەردێ هەڵگرینەوەو
هەست بە قورسایی بوون بکەین.
گەر تامان لێهات جوێن بە تریفەی مانگ نەدەین:



(زۆر جاران دیومە لە تادا، مانگ هاتۆتە خوارێ،
دەست گەیشتۆتە سەقفی ئاسمان
گوێم لێبووە بولبول زولاڵتر خوێندویێتی
زۆر جار ئەو برینەی لە قاچم هاتووە،
بەرزو نزمی زەوی پێناساندوم
گاە لە پێخەفی بیماریمدا
قەبارەی گوڵ، چەند جار گەورەتر هاتۆتە بەرچاوم
نارنج هێندەی دی ئاوساوە
رِوناکی چرایش،
چەندینجار رِۆشنتر بووە)

نەترسین لە مەرگ
(مەرگ کۆتایی کۆترەکان نییە
مەرگ قەپووی سیرِسیرِکەرە نیە.
مەرگ لە زەینی دار ئەرخەواندا رِێدەکا

مەرگ لە ئاو و هەوای سازگاربیردا هێلانەی کردووە
مەرگ لە خودی شەوگاری گوندا،
باسی سپیدە دەکا
مەرگ لەگەڵ هێشووی ترێدا
خۆی داوێتە دەممانەوە
مەرگ لە قوڕگی "گەرووسوور"دا[32] دەخوێنێ
مەرگ بەرپرسیارە لە جوانیی شاپەڕەك[33]
جاری وا هەیە مەرگ ڕەیحانە دەچنێ
جاری واش هەیە ڤۆدگا دەخواتەوە.
گاهێ لە سێبەردا ڕۆنیشتووە و لە ئێمە دەڕوانێ
هەمووشمان دەزانین:
سییەکانی خۆشبەختی پڕن لە ئۆکسجینی مەرگ).

[32] گەرووسوور، Robin ناوی باڵندەیەکە و عەرەب پێیدەڵێن (حمرە).
[33] شاپرك: شاپەڕەك: جۆرێکی پەپوولەیە.



دەرگا لە سەر ئەو گوتە زیندووەی چارەنووس
کلۆم نەدەین،
کە لەو دیو چەپەرەکانی سەداوە گوێمان لێیەتی.

پەردە لابدەین
ڕێ بدەین با هەست هەوایەك هەڵمژێ.
ڕێگە بدەین بلووق،
لە ژێر هەر پنجێکی حەز دەکا
شەونخونی بکێشێت
ڕێگە بدەین غەریزە عەودالی یاریی بێت.
پێڵاوەکانی فڕێدات و بە دووی وەرزەکاندا
بە سەر گوڵەکاندا باز هەڵدات
ڕێگە بدەین تەنیایی ستران بچڕێ،
شت بنووسێ
بچێتە سەر شەقام (پیاسە بکا).

ساکاربین،
چ لە بەردەم دیسکی بانکێکدا و
چ لەژێر سێبەری دارێکدا، سادەبین.

ناسینی ڕازی گوڵاڵە سوورە کاری مە نیە
ڕەنگە کاری مە ئەوەبێ
لە ئەفسوونی گوڵی سووردا مەلە بکەین.
لە پشت داناییەوە هەوار هەڵدەین
دەستمان لە بێهۆشیی گەڵایەکدا بشۆینەوەو
بچینە سەر خوان.
بەیانیان، کاتێ خۆر هەڵدێ، لەدایك بین
خرۆشانەکان هەڵفڕێنین
بەسەر ئیدراکی بۆشایی، ڕەنگ، سەدا و پەنجەرەدا
گڵی شێدار بپرژێنین.
ئاسمان بخەینە نێوان دوو بڕگەی بوونەوە



سییەکان لە ئەبەدیەت پڕ و خاڵی کەینەوە
باری دانایی لە پشتی پەڕەسێلکەکان،
داگرینە سەر عەرد
ناو لە هەور و چنار، لە مێشوولە و هاوین،
وەربگرینەوە.
بە دوای هەنگاوی تەڕی باراندا،
بەرەو بەرزایی خۆشەویستی بڕۆین.
دەرگا لە ڕووی ئینسان و
ڕووناکی و مێرووەکان، والاکەین.

ڕەنگە کاری مە ئەوەبێ
لە نێوان گوڵی لاولاو و سەردەما
بە دوای ئاوازی حەقیقەتدا غار بدەین.

(کاشان، گوندی چنار، هاوینی 1962)

## پۆرترێت

لە ئەستێرکی خەونەوە هاتمەوە
گۆزەی تەڕ بەدەستمەوە.
پۆلێ مەل دەیانخوێند
گوڵی لاولاو دەبۆوە.
گۆزەی تەڕم لێشکا
دەرگام لە خۆ پێوەدا
ڕۆنیشتم لە هەیوانێ
هەتا بڕوانمە تۆ..



## سادە ڕەنگ

ئاسمان شینتر،
ئاو، ئاویتر.
من لە هەیوانم ڕەعنا لە سەر حەوز.

ڕەعنا جلان دەشوا
گەڵاڕێزانە.
دایکم بەیانی دەیگوت:
وەرزێکی دڵگیرە
منیش پێمگوت:
ژیان سێوێکە دەبێ بە توێکڵەوە گازی لێگری.

ژنی دراوسێ لە پەنجەرەکەیدا

تۆڕ دەچنێ و گۆرانی دەڵێ.
من "ودا"[34] دەخوێنمەوە، جارجارەش
دەکێشم هێڵکاری بەردێ، مریشکێ، هەورێ..

هەتاوی یەکڕاست.
پەڕەسێلکەکان هاتوون.
تازە هێرۆکان بەدیار کەوتوون.
منیش هەنارێك دەپروێنم
بە دڵ دەبێژم:
چابووگەر خەڵکی دەنکی دڵانیان دیاربێ.
ئاوی هەنارە، دەپڕژێتە چاومەوە:
ئەسرین دەڕێژم.
دایکم پێدەکەنێ
ڕەعناش لەگەڵیا!

[34] ودا، بەمانای زانین و داناییە، "ریگ ودا" کۆنترین سرووده ئاریاییەکانی هیندستانە.

## ڕۆشنایی، من، گوڵ، ئاو

نەهەورێ
نەبایێ
لە قەراخ حەوزێ دادەنیشم:
هاتوچۆی ماسیەکان،
ڕوناکی، من، گوڵ، ئاو.
خاوێنیی هێشووی ژیان.

دایکم ڕەیحانە دەچنێ
نان و ڕەیحانە و پەنیر
ئاسمانێکی هەساو
گوڵانی مەخمەڵیی تەڕ
ڕزگاریش نزیکە: لای گوڵەکانی حەوشەوە.



نوور لە قاپی مسدا، چ ناز بارانێ دەکا؟
پەیژە لە دیواری بەرزەوە
سپیدە دەهێنێتە خوار.
لە پشت بزەوە، هەر شتێ نادیار.
دیواری زەمەن،
کلاورۆژنەیەکی هەیە
کە لێوەی ڕووخساری من دیار.
زۆر شت هەیە، نایانزانم
مەعلومە گیایەك هەڵکەنم، دەمرم
ڕووەو بەرزایی دەڕۆم، تا سەرکەل
من پڕ لە باڵ و پەڕم.
لە زوڵمەتا ڕێدەر دەکەم، پڕ فانۆسم
من پڕ لە نوور و مالامالم لە لم!
پڕیشم لە دار و درەخت.

لە ڕێ پڕم، لە پرد، لە ڕووبار و شەپۆل پڕم
پڕ لە سایەی گەڵای ناو ئاو
دەروونیشم چەندە تەنیا..

## پەیامێك بەرێوە

ڕۆژێك دێم و
پەیامێك دەهێنم.
ڕوناکی ڕۆدەکەمە نێو دەمارەکانەوە
هاواریش دەکەم: ئەی سەبەتەکانتان لەخەو پڕ!
سێوم هێناوە
سێوە سووری خۆر.
دێم و گوڵێکی یاسەمەن دەدەمە گەدایەك
جوتێك گوارەی دی،
بە ئافرەتێکی جوانی گول دەبەخشم
بە نابینا دەڵێم:چەند پڕ تەماشایە باخ!
دەبمە گەڕۆك، کۆڵانەکان دەگەڕێم، جاڕ دەدەم:
های شەونم ، شەونم ،شەونم.



ڕێبوارێك دەڵێ: بەڕاست، شەوێکی تاریکە
ئەستێرەیەکی کشاوی دەدەمێ
کیژێکی بێ لاق لە سەر پردێکە،
"ورچەگەورە"[35]ی بە گەردندا هەڵدەواسم
چی جوێنی سەر لێوەکانە، دەپێچمەوە
هەرچی دیوارە، لەبنا هەڵیاندەکەنم.
بە چەتەکان دەڵێم:
کاروانیك هات بارەکەی بزە!
هەورەکان لەت و پەت دەکەم.
چاوەکان و خۆر،
دڵەکان و عەشق،
سێبەرەکان و ئاو
لقی دارەکان و با، پێکەوە گرێدەدەم
خەونی مندالآن و

[35] (دب الآکبر)، ورچەگەورە: یەکێکە لە سیما هەسارەییەکانی قوتبی سەرووە و گوایە لە ورچ دەچێ.

دەنگی سیڕسیڕکەرەکان هاوجوت دەکەم.
کۆلارەکان هەڵدەستێنم،
گوڵدانەکان ئاو دەدەم.

دێم و لە بەردەم ئەسپ و مانگاکاندا،
تفاقی سەوزی نەوازش ڕۆدەکەم.
بۆ ماینە تینووەکان، سەتڵێك شەونم دەهێنم
کەرێکی پەککەوتە لە سەر ڕێگایە،
مێشکەکانی لێدەر دەکەم.
دێم و لە سەر هەر دیوارێك، مێخەکەیەك دەڕوێنم
لە داوێنی هەر پەنجەرەیەکدا شیعرێك دەخوێنمەوە
هەر قەلەڕەشکەی سنەوبەرێکی پێدەبەخشم.
بە مار دەڵێم:
چەند شکۆدارە بۆق!
ئاشتی دەبەخشم



ئاشنا دەکەم
بەرێدا دەرۆم، ڕووناکی دەخۆم
خۆشەویستی دەبەخشمەوە.

## ناونیشان

"مەنزڵی یار لە کوێیە؟"

سپیدە بوو کە سوار پرسی.
ئاسمان ئێستێکی کرد.
ڕێبوارەش تاڵی ئەو تیشکەی بە لێویەوە بوو[36]
بە تاریکی زیخەکانی بەخشی و
بە پەنجە هێمای بۆسپیارێك کرد و گوتی:
بەر لەوەی بەو درەختە بگەیت،
کوچە باخێکە لە خەونی یەزدان سەوزترە
عەشق لە وێدا، هێندەی پەڕەکانی ڕاستگۆیی شینە.
دەڕۆی تاکو بنەوەی ئەو کۆڵانەی

[36] پێدەچێ ئاماژەبێ بە جگەرەکەی سەر لێوی..



لە پشت باڵقییەوە سەر دەردەهێنێ.
پاشان بەرەو گوڵی تەنیایی لادەکەیتەوە
دوو هەنگاو بەر لەوەی بە گوڵە بگەیت:
لە پەنای فوارەی ئەفسانە زەمینییەکانەوە
دەوەستی و
ترسێکی شەففاف داتئەگرێ
لە ڕاستگۆیی مەوجی فەزادا،
گوێت لە خشپەیەك دەبێ
منداڵێ دەبینی،
بە دارکاجێکی بەرزدا چۆتە سەر،
تا لە هێلانەی نوور بێچوو دەربێنێ
تۆش لەو منداڵە دەپرسی،
"مەنزڵی یار لە کوێیە".

## ئـــــاو

ئاو قوڕاو نەكەین:
واپێدەچێ لە دوورەدەست،
كۆترێ ئاو دەخواتەوە.
یان لە بێشەلانێكی دووردا،
پەڕەسێلكەیەك باڵەكانی دەشوا.
یانژی، لە ئاواییدا گۆزەیەك پڕ دەبێت.

ئاو قوڕاو نەكەین:
ڕەنگە ئەم ئاوە پاكە بڕواتە بن سپیارێك[37]
تا بیشواتەوە خەمی دڵێك.
ڕەنگە دەستی دەروێشێك

37 سپیار، سپیدار، دار چنار.



نانێكی ڕەقی پێ تەڕ كات.

ئافرەتێكی جوان هاتە كەنار چەم،
ئاوەكە قوڕاو نەكەین:
ڕوخساری جوان دووجار دەدرەوشێتەوە.

چەند شیرینە ئەم ئاوە!
چەند زولاڵە ئەم ڕوبارە!
خەڵكی ئەو بنارە چەندە دڵخۆشن!
كانیان تەقیوە، مانگایان پڕشیر بێت
من گوندەكەیانم نەدیوە،
بێگومان لای پەرچەیانەوە شوێن پێی خوا دەبینرێ
لەوێ، تریفە تارمایی قسە ڕوناك دەكاتەوە
بێگومان لەو گوندەی سەرێ،
چینی دیوارەكان نزمن.

لەوێ شین، شینە.

خونچەیەك بپشكوێ، خەڵكی ئاوایی دەزانن.

دەبێ چۆن ئاواییەك بێت!

كۆڵانی باخی پڕ بێت لە مۆسیقا.

خەڵكانی گوێ ڕووبار لە ئاو تێدەگەن

قوڕاویان نەكرد،

ئێمەش

ئاوەكە قوڕاو نەكەین.